## ١٩- (خوای گەورر) چاكترن پی دە بەخشیت لەوەی پیشتر :

عن (ام سلمه )-رضي الله عنها – قالت : سمعت رسول الله ﷺ يقول :(( ما من مسلم تصيبة مصيبة فيقول ما أمره الله : (انا لله وإنا إليه راجعون ، اللهم أجرني في مصيبتي ، وأخلف لي خيرا منها ، إلا أخلف الله له خيرا منها ))، قالت : فلما مات أبو سلمة قلت : أي المسلمين خير من أبي سلمة ... ثم إني قلتها ، فاخلف الله لي رسول الله ﷺ ) .[55]

واتا : له (دايكه سلمه ) – خوا لی رازی بیت – ده لیت : گويم له پيەمبەری خوا ﷺ بوو دەی فەرموو :

هەر كەسيك تووشی بەلاو نسيبەت ناخۆشيەك ونەهامەتيەك يان كەسيكی لی وە فات كرد ،ئەوا بلی (انا لله وإنا إليه راجعون ) واته : ئيمه هەر خوای گەوره خاوه نمانه هەر بۆ لای ئەويش دەگەرينەوه ،وه بلی : ئەی خوا يه پاداشتم بدەروە لەسەر ئەو بەلاو نسيبەتەی تووشم هاتووه ، وه چاكتر لەوەی ليت سەندمەوە پيم ببەخشە ..!! خوای گەوره پاداشتی چاكتری دەداتەوه چاكتری پی دەبەخشيت . (ام سلمه ) دەليت: كاتی (ابو سلمه ) وەفاتی كرد ، من ئەوەم ووت كه پيغه مبەری خوا ﷺ فەرمانی پيدا م ، ئيتر ئەوه بوو خوای گەوره هاوسەری لەو چاكتری پی بەخشيم كه پيغەمبەری خوا ﷺ بوو ..!!

## ٢٠-ئارام گرتن ريگايی عزەت و كرامەت پی دەبەخشيت له دونيادا :

ئارامگرتن ئەو ريگايه يه بەنده پەيوست دەكات بۆ عزەت و كرامەت له ژيانی دونيا دا ، چونكه ئەو كەسە سەری ناچەمينيتەوه بۆ خەلك ، واته سەر بەلنده و بەو نيعمەتانەی كه خوای گەوره پی بەخشيوه سوپاس گوزاره ، وه هيچ كات دەست له هيچ كەسيك پان ناكاتەوه ، چونكه رازيه به قەدری و زرق رۆزی خوای گەوره كه بۆی بريوه تەوه ،سوپاس گوزارو خۆگرو ئارام گره ، ئەمانەش ده بيته هۆی ئەوەی كه له ژيانی دونيادا عزەت كرامەتی خۆی هەبيت ..!!

له غەزای يرمووك دا (أبو الاعور السلمی ) بانگی كرد ( ئەی قەومی قريش يان يا معشر قريش ، پشكی خۆتان بگرن ئەوەش له پاداشتی ئارام گريتانه ،چونكه ئارام گرتن له دونيادا عزەت و كرامەته پی ده بەخشيت ، وه له دوا رۆژيش دا فەزل و رەحمەتيكی گەوره يه ، بۆيه ئارام بگرن و دان بەخۆتان دا بگرن .[56]

[55] -صحيح مسلم برقم (٩١٨).
[56] -ابن عساكر تاريخ دمشق (٥٦/٤٦ ).

## دەربارەی باسە كانی ئارامی گرتن

سەرچاوەی یان بنچینەی ئارامی گرتن لە سی شت دایە : ئارامی گرتن لەسەر فەرمانەكانی خوا دا ، وە لە گوناهو تاوان و قەدەغەكراوەكان دا ، وە لەسەر چارە نووس و قەزاو قەدر دا ، وە ئەگەر بمانەوەی باسی بكەین دەربارەی ئارامی گرتن ئەوا باسە كە زۆری هەلدەگریت ، بەلام ئیمە ئەوانە باس دە كەین كە زۆر گرینگ و بەسوودن دەربارەی باسە كانی ئارامی گرتن و خۆگری ، چونكە مرۆڤ دەبیت بە باسیكی زۆر تی پەریت ، ئیمەش ئەوانە باس دەكەین كە تایبەت و گرنگن ..

**یەكەم :وە لە باسە كانی: ئارامی گرتن لەسەر ئەو بەلاو نسیبەتانەی لەدونیادا هەن :**

دونیا بە سروشتی خۆی ، پر لە هیلاكی ماندوو بوون زەحمەتی قورسی ،وە پر لە بەلاو نسیبەت ونەهامەتی و ناخۆشی ، وە هیچ مرۆڤیك لە دونیادا ناتوانیت تاسەر بەختەوەری بە تەنها بەدەست بهینیت بەس ، چۆنكە ئەوە پیچەوانەی سروشتی ژیانی دونیایە ، تەنانەت پاشاو ملیك و سەركردە و دەست هەلات دار و فەرمان رەواكانیش نەیان توانیوە ..!! بە لكو تا ئە و كاتەی كەلە ژیان دایە بە ئازار چیشتن نارەزای دەربرین دەژیت ئارامیە كەشی پیوستە مادام لە ژیان دایە بۆ هەمیشە ..!!

بی گومان لە هیلاكی نارەحەتی دایە بەردەوام بەلاو نسیبەت و فتنەو ئاشووب رووی تی دەكات ..!!

هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ فِي كَبَدٍ﴾.[٥٧]

واتا : سویند بەخوا ئیمە مرۆڤ مان دروست كردووە بەردەوام لە نارەحەتی و سەغلەتی و كیشەو ناخۆشیدا.

هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت :﴿ وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ بِشَيْءٍ مِنَ الْخَوْفِ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِنَ الْأَمْوَالِ وَالْأَنْفُسِ وَالثَّمَرَاتِ وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ﴾.[٥٨]

واتا : سویند بە خوا تاقیتان دەكەینەوە بە كەمیك لە ترس و بیم و برسیەتی و كەم بوونی مال و سامان و مردنی كەس و كارو تیاچوونی بەرو بوومی كشتوكال ، جا مژدە بدە بەو كەسانەی كە خۆ گرو ئارامگرن..!!

( لە سەر دەردو بەلاو نسیبەت و فتنەو ئاشووب ) دەبیت ئارام گرو خۆ راگر بین چونكە دونیا تاقی كردنەوەیە بۆ بەندە ی ئیمانداری دامەزراو سوپاس گوزاری نیعمەتەكانی خوای گەورە ..!!

---

[٥٧] - سورة البلد (٤).
[٥٨] - سورة البقرة (١٥٥).

**دووەم :وەلە باسە کانی ئارامی گرتن لە سەر هەواو هەوەس ئارەزووە کانی(دڵ) و دەروون دا:**

( **خوای گەورە** ) **دەفەرموویت :** ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَالُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾.[٥٩]

**واتا : ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هیناوە ، هەول بدەن نەمال و سامانتان ، نە رۆلە کانتان ، ن بنە هۆی ئەوەی کە لە یادی خواو بەدەستهینانی رەزامەندی ئەو کەمتەرخەمی و بی ئاگاتان بکەن ، جا هەر کەس لە یادی خوا کەم تەرخەمی بکات ، ئا ئەوانە هەر خۆیان خەسارە تمەند و زەرەرمەندن ..!!**

**عن ( عبدالرحمن بن عوف ) ﷺ قال : (( أبتلينا مع رسول الله ﷺ بالضراء فصبرنا ، ثم أبتلينا باسراء بعده فلم نصبر )) .**[٦٠]

**واتا : لە ( عبدالرحن کوری عوف ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : لە گەل پیغەمبەری خوا ﷺ بە ناخۆشی و نەبوونی و ئەشکەنچەو ئازار تاقیکراینەوە ئاراممان گرت ، بەلام بە خۆشگوزارانی و بە دەولە مەندی تاقیکراینەوە ئارامان نەگرت ..!!**

**وە هەندیك لە خەلکی تاقی دە کرینەوە بۆ نموونە لە زیندان یان بەندیخانە دا ئارام دەگرن ، وە بەلام ئەگەر تاقی بکریتەوە بەوەی کەلە کات وساتیکی خۆش دا دەژیت ، وە لەدوای ئەوە شدا دەرگای دونیات لی کراوە تەوە بەوە ی کەلەمال سامان خاو خیزانەت دا ئەوا ئارام ناگری لەسەری ، وە هەموو خەلکی وەك یەك نین لە ئارامی گرتن ،وە ئەلین : بەلاو لەسەر ئیماندار ،بی باوەر ئارام گریە ،وە ئارام ناگری ت لە کاتی خۆش گوزەرانی دا تەنها هاوریە ..!! .**[٦١]

---

[٥٩] - سورة المنافقون (٩).
[٦٠] سنن الترمذي برقم (٢٤٦٤).
[٦١] - تسلة أهل المصائب ص(١٨٥).

**وە ئارامی گرتن لەسەر هەواو هەوس ئارەزووی دل ئەم چوار رەهەندەی هەیە :**

أ- نابی دل بەوانە بدات پشتی پی ببەستیت و پی هەلبخەلەتیت ،وە پی لەخۆبایی لووت بەرزو ناسوپاس گوزار بیت ،( چونکە ئەوە خۆشیەکی ناشرینە ( خوای گەورە ) رقی لیەتی زۆر ..!!

ب-وە نابیت بۆ بەدەست هینانی هەواو هەوس ئارەزووی دل دەروون و خۆشی دونیا خۆی ماندوو بکات ، وە زیدە رووی بکات بۆ بەدەست هینیان ، هەر وەك جۆریك لەخلكە ئەوانەی کە خاوەنی سەروەت سامانیکی زۆرن شەو رۆژیان خستۆتە سەریك بۆ بەدەست هینانی سەروەت سامان مالی دونیا ، وە کاتی ئەوەشیان نیە کە تیدا نویژو زکرو یادی خوای گەورە بکەن ،ئەو کاتەی هەشیانە تەنها بۆ کۆبوونەوە سەفەر کردن دەمەقالی و کیشمەکیشی دونیان نەوەك قیامەت بیت ،هیچ کاتیك تەرخان ناکەن بۆ زکرو یادی( خوای گەورە ) ، وە هەندیك لەو کەسانەی کە کار بەدەست و فەرمان بەرن لە شوینەکانی دامو دەگاکانی دەولەت ئەوندە مەکورن لەسەر کارە کەیان هیچ کاتیان نیە بۆ زکرو دیاد فەرمان و واجبە شرعیە کانی ( خوای گەورە )، هەروەها ئەو شانەی کە قەدغەو حرامکراوە کان دەستی پیوە دە گرن وە ، وە زۆر گرنگی بە کارە کانیان دەدەن جگە لەیادو زکری ( خوای گەورە ) ،وە کار کردن لە لای ئەو کەسانە هەموو شتیکە ،ئەو کە سانە کارو دەست هەلاتی خۆیان وە ك ئەوە وایە بیپەرستن لە جیگای ( خوای گەورە ) هەروەك یەکیك لە زاناکانی ئینکلیز لە بەریتانیادا ئەو ووتەی هەیە کە دەلیت : ( خەلکی لە بەریتانیا دا بانکی ناوەندی دەپەرستن شەش رۆژ لە حەفتە یەك دا ،ئینجا روو دەکەن کنیسە لە رۆژی حەفتەمدا ..!! )

ج-لە بەدەستهینانی مافی ( خوای گەورە ) لەو نیعمەتانە ئارامگربی ، وەك واجباتی زەکات و سیلە ی رەحم لە گەل کەس و کارو وە خیرو صدەقە دا ، وە بەفیرۆی نەدات ،دە نا لی وەردەگیریتەوە ..!!

د-دەبیت ئارام بگری خۆگر بیت لە دوو رکەوتنەوە لە حەرام و قەدغەکراوە کاندا ، وە ( دلّ ) دەروونی هەرچی ویست بە گویی نەکات ،دەنا دەروونی دەیخاتە گوناهو تاوان خراپە کاری حەر ام و قەدغەکراوەکاندا ، ئەگەر هەموو خۆپاریزیەکیش بکات ، ئەوا هەر دەکەویتە گوناو تاوان و مکروە خراپە کاری ، وە لە خۆشی و خۆش گوزەرانی تەنها راست گۆ لە خوا ترس ئارام دەگرن ، هیچ کات لە خۆبایی و لووت بەرز ئارام ناگرن ..!!

**سى يەم : وەلە باسە كانى :ئارامى گرتن بەوشتەنەی كە در دەكەون لە لای خەلكانيك دا:**

**وە بۆ ئەوەی كە فريونەدرين بەوشتانەكە چيژيان لی وەر دەگرين ،كە وە ك مال سامان منداله ، هەر وەك ( خوای گەورە ) دەفەرموويت :** ﴿وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَى مَا مَتَّعْنَا بِهِ أَزْوَاجًا مِنْهُمْ زَهْرَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَى﴾ .[٦٢]

**واتا :ئەی ئيماندار تۆ چاوەكانت مەبرە ئەو نازو نيعمەتەی كە هەنديك خەلكمان لی بەرهەوەر كردووە ، كە زينەت و خۆشی و رازاوەی ژيانی دونيايە ،بۆ ئەوەی لەو نازو نيعمەتە تاقيانبكەينەوە ،بی گومان رزق رۆزی پەر وەردگارت ( لە بەهەشت ) دايە چاكترو بەردەوام ترە ..!! بەلی مال سامان مندال فتنەو ئاشووبە ..!!**

**وە هەنديك يان بەشيك لە قەومی قارون نەيان توانی ئارام برگرن بەم بەشە كەميەی كە لەدەستيان دا بوو ، هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموويت :** ﴿فَخَرَجَ عَلَى قَوْمِهِ فِي زِينَتِهِ قَالَ الَّذِينَ يُرِيدُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا يَا لَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَا أُوتِيَ قَارُونُ إِنَّهُ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ﴾.[٦٣]

**واتا : ئينجا رۆژيك قارون خۆی ساز دا و بە رازاوەيی چووە دەرەوە بۆ ناو قەومەكەی بۆ كەشخە كردن و خۆ نواندن ، ئەوانە كە ئاواتيان ژيانی دونيا يە ، ووتيان : ئای خۆزگە ئيمەش وەكو قارون ،سامان و دەسەلاتمان ببوايە ، بەراستی خاونی بەختيكی گەورە يە ..!!**

**وە ( خوای گەورە ) لە نيوان هەنديك خەلك دا رزق رۆزی و مال سامان مندالی پی بەخشيوە ، دوای لی دەكات بۆ پشيبركی كردنی خيرو چاكە دا ..!! هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموويت :** ﴿أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُمْ بِهِ مِنْ مَالٍ وَبَنِينَ نُسَارِعُ لَهُمْ فِي الْخَيْرَاتِ بَل لَا يَشْعُرُونَ﴾ .[٦٤]

**واتا :ئايا ئەوانە وادە زانن كە ئەو مال و سامان و نەوە و منداله مان پيپيان دە بەخشين ..؟! هۆی ئەوە يە خۆشمان دە وين ..؟!نەخير ، وانی يە ، مەبەستمانە بە پەلە لە نازو نيعمەت بەهرە وەريان بكەين ..؟! بەلكو ئەوانە هەستی پی ناكەن ..!!**

[٦٢] - سورة طة (١٣١).
[٦٣] - سورة القصص (٧٩).
[٦٤] - سورة المؤمنون (٥٥-٥٦).

**چوارەم : وە لەباسە گەورە کان ئارامی گرتنی لەسەر سەختیەکانی بانگەوازی بۆ لای خوای گەورەیە:**

**چونکە لە زمانەدا یان لە م رۆژگارە دا خەلکی دەترسن لە سەر بانگەوازی کردن بۆ ئاینە کەی خوای گەورە وە دوو ردەکەونەوە لە ئاین و خوا پەرستی بە هۆی ئەو نارەحەتی سەختیانەی کە تووشیان دەبیت لەلایەن دەست هەلات داران و فەرمان رەوەکانی سەر زەوی بەگشتی ،وە ئەم بانگەوازیەش پیویستی بە بانگەوازیەکی گەورە هەیە بۆ نەکۆلی بەکین لە خرا پە کاری و قەدەغەکراوە کان ، بۆ ئەوەی دەرز کەلین نەکەویتە بەردەم راستیە کان ..!!**

**وە کاتیك ( عمری کوری عبدالعزیز ) - رەحمەتی خوای لی بیت - فەرمانرەوا بوو ، وە هەستی بە لیپرسیارەیتی گەورەی لەسەر لە بەردەم ( خوای گەورە ) کە ئە ئەمانەتەی پی بەخشی بوو ، وە ك گۆرینی ئەو سەر لی شیواوانەی کە لە سنوور دەچوو بوون ، وە ( عمری کوری عبدالعزیر ) – رەحمەتی خوالی بیت – دەلیت : ( تەنها ئەو ە نەبیت کە من چارەسەر یان مامەلە لەگەل شتیکداتەنها ( خوای گەورە ) یارمەتی دەرە ، چونکە ئەو زاتە دانایەکی زۆر گەورە یە ،وە گەورەیی لەسەر بچووکە ، وە پاراوی یان فصیح لەسەر ئەعجمی ، وە کۆچ کردن لەسەر دەشتە کی ، وە لی پیچینەوە ژیانی دونیا حیساب کردن هیچ کەسیك حەق وراستی نابینی جگە لە زاتی ( خوای گەورە ) نەبیت ..!! .**[٦٥]

**وە ئەوە ( نوح ) -علیه السلام - ئارامی گرت بە ئارامگرتنیکی گەورە لە بانگەوازیە کەی دا ، ئارامی گرت هەزار سال تەنها پەنچا سال نەبیت لە سەر هەموو تاقی کردنەوە کانی ژیانی دونیادا ، هەر وەك ( خوای گەورە ) دەف رمووبت :** ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلًا وَنَهَارًا (٥) فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَائِي إِلَّا فِرَارًا﴾.[٦٦]

**واتا : دوای سەدەها سال بانگەوازی ( نوح ) – علیه سلام - سالای کرد و ووتی : ئەی پەروەردگارا من بەشەو بە رۆژ بانگب قەوم و گەلەکەمم کرد بۆ یەکخوا پەرستی و پاریزکاری ..!! کەچی بانگەوازەکەی من هیچی زیاد نە کردن ، تەنها راکردنیان نەبیت ..!!**

---

[٦٥] - الاعتصام للشاطي (١٢/١ ).
[٦٦] - سورة نوح (٥-٦).

بەلی نارەحەتی هیلاکی بانگەوازی کردن ،تەنها جستەیی یان لاشەیی نیە ، بەلکو دەروونی نفسی شە کە کاتیك بانگەواز كاریك گویی لە قسە كانی دوژمن دەبیت واتە دوژمنی ئاینی ئیسلام ، ئـەوە بـەدلنیایی ئازاری دەروونی یان نفسی دەدریت ،هەر وەك ( خوای گـەورە ) دەفـەرموویت :﴿ لَتُبْلَوُنَّ فِي أَمْوَالِكُمْ وَأَنْفُسِكُمْ وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكُمْ وَمِنَ الَّذِينَ أَشْرَكُوا أَذًى كَثِيرًا وَإِنْ تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا فَإِنَّ ذَلِكَ مِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ﴾. [٦٧] واتـا : سویند بیت بی گومان تـاقی دەکرینەوە لە مال و دارایی و خۆشیتاندا زیان لـە سـاماندا دەکـەن ،خۆتان تووشی ناخۆشی و ئازار دەبن ،هەروەها سویند بیت لە خاوەنانی کتیبی پیش خۆتان و لەموشریك و هاوەلگەرانەوە ئازاریکی زۆر دەبیسن ،ئەوەندە بوختان و قسەی نابەجی دەبیستن ، وەك ئازار بە گویتان بکەویت وایە ، بەلام ئەگەر خۆراگرو ئارام گر بن و پاریزکار بن وە لە خوا بترسن ،لـە سـنوور دەنەچـن ، بەراستی ئەو هەلویستە لە کارە پەسەند ە کردەوە پایە دارە کانە ..!!

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿وَاصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُونَ وَاهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا﴾ . [٦٨]

واتـا : لە بەرانبەر گوفتاری نارەوا و نابەجی خوانە ناسانەوە هەردەم خۆگرو ئارامگر بە شـیوازیکی جـوان بەجییان بهیلە ..!!

بەلکو گوتیان بە گەلە کانی خۆیان ، کە خوای گەورە دەفەرموویت ﴿وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَىٰ مَا آذَيْتُمُونَا ۚ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُتَوَكِّلُونَ﴾ .[٦٩] واتا :مەرج بیت لەسەر ئەو هەموو ئازارو نەهامەتی و ناخۆشیەی کەئیوە بۆ ئیمـەتان پیش هیناوە ،خۆگرو ئارام گر بە ئارام دەبین ،دەبا ئەوانەی کە پشتیوانیان پیویستە هەرپشـت بـە خـوا ببەستن ..!!هەروەها ( خـوای گـەورە ) دەفـەرموویت : ﴿ وَلَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِنْ قَبْلِكَ فَصَبَرُوا عَلَى مَا كُذِّبُوا وَأُوذُوا حَتَّى أَتَاهُمْ نَصْرُنَا﴾ .[٧٠] واتـا : سـوینبیت بـی گومـان پیغەمبـەرانی پـیش تـوش بروایـان پینەکراوە لەگەل ئەوەشد ئەوان دانیان بە بە خۆوگرت ئارامیان گرن لەسەر ئـەو بـروا پـی نەبوونـەیان ئازارو ئەکەنچەش دران ، هەتا سەرئە نجام سەرکەوتنی ئیمەیان بۆ هات و بەهەروەر بوون پیی ..!!

وە ئەوەش بـانگەواز کاری ئاینی خوای گەورە کە ریگایە کی دووری لە پیشە وە ئازار و ئەشکەجەشی لەبەردەم دایە ،ئەو ریگایە زۆر سستەو لەسەر خۆیە بۆ گەیشنت بە رەزامەندی خوای گەورە وە گەیشتن بـە بە هەشتەکەی ئەوەندە ئـاسانیە بی گومان تووشی ئازارو و ئەشکە نجەی زۆر دەبیت لـە رووی دەروونـی لـە روویی جەستەیەوە لە سەر بـانگەوازی خوای گەورە و بەلاو بوونەوەی ئاینی راست و دروستی ئیسلام ..!!

---

[٦٧] - سورة ال عمران (١٨٦).
[٦٨] - سورة المزمل (١٠).
[٦٩] سورة ابراهيم (١٢).
[٧٠] سورة الانعام (٣٤).

هەروەك ( خـوای گـەورە ) دەفـەرموویت : ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَنْ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُمْ مَثَلُ الَّذِينَ خَلَوْا مِنْ قَبْلِكُمْ مَسَّتْهُمُ الْبَأْسَاءُ وَالضَّرَّاءُ وَزُلْزِلُوا حَتَّى يَقُولَ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ مَتَى نَصْرُ اللَّهِ أَلَا إِنَّ نَصْرَ اللَّهِ قَرِيبٌ﴾ .[٧١] واتـا : ئایا لا تـان وایە هەروا بە ئاسانی دەچنە بە هەشتەوە بی تەنگانـە و ناخۆشـی ..؟! مەگەر نموونەی ئیماندارانی پیشووتان بۆ باس نەکراوە ..؟! کە تووشی شەرو ناخۆشی و تەنگانە و گرانی و نەداری بوون و تەنکیان خواردوە و زۆریان بۆ هاتووە بەرادەیەك ، هە تـا پیغەمبەرەکـەیان و ئەوانـەی باوەریان هیناوە لەگەلیدا ، دەیان ووت : کەی پەروەردگار سـەرکەوتن دەبەخشـیت ..؟! ئـیتر کـەی خـوا یارمەتی دەنیریت ..؟! ئاگادار بن و دلنیابن بەراستی یارمەتی خوایی زۆر نزیکە .

هەروەها ( خوای گەورە ) دەفـەرموویت : ﴿حَتَّى إِذَا اسْتَيْئَسَ الرُّسُلُ وَظَنُّوا أَنَّهُمْ قَدْ كُذِبُوا جَاءَهُمْ نَصْرُنَا فَنُجِّيَ مَنْ نَشَاءُ وَلَا يُرَدُّ بَأْسُنَا عَنِ الْقَوْمِ الْمُجْرِمِينَ﴾ .[٧٢] واتا : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ وامەزانە کە ئەم ریگە یە بەگول و گولزرا چینراوە ،بەلکو پرە لە ناخۆشی و ئازار کە گەیشتووە تەرادەیە کە هەتا بگـرە کاتیك پیغەمبەران تووشی نائومیدی وبی هیوایی دەبن و گومان وادەبەن کە بەراستی ئەوان بەرنامەکەیان بە درۆ زانراوە ..!! ئەوە ئاو لەو کاتی بی هیواییدا ، سەرکەوتنی تـاییـەتی ئیمـەیان بـۆ دیـت ،ئەوسـا ئەوەی بمانەویت و شایستە بیت رزگاری دەکەین ،جا کەس نیە بتوانیت تۆلـەی تونـدو تیـژی ویمـە لـە کەسانی تـاوانبارو تـاوانکار بگیریتەوە و بەرپەرچی بداتەوە..!!

هەروەها کە هەموو کەسیك دوای حەق و راستی بکات ، وە فەرمان بە چاکە بکات و نهی لـە خرا پـە کـاری بکات ، ئەوا بی گومان روو بەرووی ئیش ئازاری دە بیتەوە بەدلنیاییـەوە لـە لایـەن خرا پـە کـارو گەنـدە گەندەلکارانەوە ، ، لەو کاتەدا پیویستە دان بەخۆ دابگری و صبر ئارامی هەبیت ، ئارامگرتنیش تەنها لە خوا وە یە ،وە پشت بەست بە خوا ، وە گەرانەوە بۆ لای خوای بـالادەست و بەرز بلند میهرەبـان ..!!

---

[٧١] - سورة البقرة (٢١٤).
[٧٢] - سورة يوسف (١١٠).

## پینچەم : وە لە باسەکانی ئارامی گرتن ، نەهامەتی و ناخۆشی زۆر لە دونیادا:

بەڵی ئارامی گرتن لە کاتی روو بەروو بوونەوەی دوژمن لە جەنگ دا کاتی ریزە کان دەوەستن لە چاوەراوانی شەر جەنگ و کوشتار کردندا ، بی گومان لەم چرکە ساتەدا پیویستی بە ئارامی گرتنی زۆر هەیە ئـەوەش مەرجی سەرکەوتنە ، چونکە راکردن لە جەنگ و جیهاد یەکیکە لە گوناهە گەورە کان ، چونکە خوای گەورە واجبی کردووە کە خۆراگر بن ، هەر وە دەفەرموویت : ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَاثْبُتُوا وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ .[٧٣] واتا : ئەی ئـەو کەسـانەی ئیمـان و بـاوەرتـان هینـاوە : کاتیك دەگەن بە دەستیەك و رووبە رووتـان دەبنەوە ئەو ە دبیت خۆراگر بن و سەنگەر چووڵ نەکەن وە زۆر یادی خوا بکە و لی بپارینەوە ، بۆ ئەوەی ئیوە سەفرازو سەرکەوتوو بن ..!!

وە دەبیت بە ئاگابیت لەوەی کە لە کاتی جەنگ و شەرو شۆرد دا لـە بەرانبـەر دوژمـن رانەکـەیت و پەشت هەلکەیت و پاشەکشە بکەیت ، وە جەنگەکە دەشیویت و نارەحەت دەبیت ، وە پە یمانەکە دەشکیت ، ئەوەش بە ئارمگرتنی زۆر دەبیت لە جەنگ دا ..!! هەر وە ك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَنْ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ اللَّهُ الَّذِينَ جَاهَدُوا مِنْكُمْ وَيَعْلَمَ الصَّابِرِينَ﴾ .[٧٤] واتـا : یان وا گومانتان دەبرد هـەروا بـە ئاسانی دەچنە بەهەشتەوە ..؟! کە هیشتان ( خوای گـەورە ) لـە جیهـانی واقعـدا دەریشـی نەخستووە کامەتـان هەول و کۆش و جیهادی کردووە و کامەتان خۆراگرو ئارامگر بووە ..!! هەرووها ( خـوای گـەورە ) هەر لە سورەتی ال عمران دا دەفـەرموویت ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِنْ مَاتَ أَوْ قُتِلَ انْقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ وَمَنْ يَنْقَلِبْ عَلَى عَقِبَيْهِ فَلَنْ يَضُرَّ اللَّهَ شَيْئًا وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ﴾ .

واتا : ﷺ تەنها پیغەمبەریك نەبووە وەفات بکات ، بـی گومـان پیغەمبـەرانی پـیش ئـەویش وەفاتیـان کردووە ، ئایا ئەگەر ووەفاتی کرد یان کوژار و شەهید بوو ، ئیوە پاشگەز دەبنەوە وە هەلدەگەرینەوە..؟! لەو ئاین و دینەی کە بە ئیوەی راگەیاندووە ..؟! خۆ ئەوەی هەلگەریتەوە و پاشگەز بیتەوە ، ئەوا هەرگیز زیان بە خودا ناگەیەنیت ..!! وە لەدا هاتوویەکی زۆر نزیك دا ( خوای گـەورە ) پاداشـتی سوپاسـگوزاران دەداتەوە ..!!

---

[٧٣] - سورة الانفال (٤٥) .
[٧٤] - سورة ال عمران (١٤٢).

وە سوپاس و ستایشکردنی ( خوای گەورە ) لەدوای کۆمەلە ئیمانداران ئەوەی کەلە ژیان بەردەوام ودەمینەوە وە لە ریزی یان دەستەی ئەوانەی کەلە  ئۆپراسیونی بەردەوامی دوای چیرۆکی تالوت  کە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِالْجُنُودِ قَالَ إِنَّ اللَّهَ مُبْتَلِيكُمْ بِنَهَرٍ فَمَنْ شَرِبَ مِنْهُ فَلَيْسَ مِنِّي وَمَنْ لَمْ يَطْعَمْهُ فَإِنَّهُ مِنِّي إِلَّا مَنِ اغْتَرَفَ غُرْفَةً بِيَدِهِ فَشَرِبُوا مِنْهُ إِلَّا قَلِيلًا مِنْهُمْ فَلَمَّا جَاوَزَهُ هُوَ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ قَالُوا لَا طَاقَةَ لَنَا الْيَوْمَ بِجَالُوتَ وَجُنُودِهِ قَالَ الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُمْ مُلَاقُو اللَّهِ كَمْ مِنْ فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾ .[٧٥]

واتا : ئینجا لە کاتیك دا تالوت سەربازە کانی جیا کردەوە پی ووتن :وا ئیمە دەرۆین ،بی گومان خوا لەریگە کەماندا تاقی مان دەکاتەوە  بە رووباریك  دوای ماندوو بوون و تینوویەتی  ،جا ئەوەی لی بخواتەوە ئەوا سەربازی من نیە  و بگەریتەوە  و ئەوەی ئەی چیژیت یان تەنهالویچیك بەدەستی خۆی بخواتەوە ئەوە بەراستی سەربازی منەو دەپەریتەوە و دەرۆین ، جا لە گەل ئەو روون کردنەوەیەشدا زۆربەیان لە ئاوی روو بارە  کەیان خواردەوە ،کەمیکیان نەبیت ، جا کاتیك لی پەرینەوە  خۆی  ئەوانەی باوەریان هینابوو لە گەلیدا هەندیکیان  ووتیان : ئەمرۆ زەحمەتە بەم ژمارە کەمەوە  بەسەر جالوت زال بین یان سەر بکەوین   بەسەر سەربازانی جالووت بین ، ئەوانەی دلنیيا بوون بە  خزمەتی  پەروەردگاریان دەگەن ووتیان : مەترسن  چونکە چەندەها جار دەستەی کەم ،زال بوو بەسەر  دەستەی زۆردا بە فەرمانی خواو  خوا یاور یاوەری  خۆگرو ئارام گرانە ..!!

ئەوە بوو هەندیکیان سەرپیچیان کردوو ئاوی رووبارە کەیان خواردەوە ،وە هەندیکی تریشیان ئارام و خۆ راگر بوون وە مانەوە تەسلیمی خوا گەورە بوون ،کوشتاریان کردو سەر کەوتن بە سەرجالووت دا ..!!

[٧٥] - سورة البقرة (٢٤٩).

**شەشەم : وە لە باسەکانی ئارامی گرتن کە زۆر گرینگە : ئارامی گرتن لە سەر دوا کردنی عیلم و زانست :**

**بەلی چونکە دوای کردنی عیلم زانست سەختیەکی زۆر گەورەی تیدایە ، چونکە ئـەو کەسـەی دوای علـیم و زانست دەکات ئەگەر لەریزی ئارامگران نەبیت ، ئەوا ناگەت بەو علیم و زانستەی کە بۆی دە چیت ..!!**

**وە هەروەها کە حەزەتی ( خدر ) – علیە السلام – بە ( موسی ) –علیە السلام – دەلیـت :**﴿قَالَ إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴾ **موسی وەلامی داوە ووتی :** ﴿ وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَى مَا لَمْ تُحِطْ بِهِ خُبْرًا﴾
**موسی وەلامی داوە ووتی :** ﴿قَالَ سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللَّهُ صَابِرًا وَلَا أَعْصِي لَكَ أَمْرًا﴾ .[٧٦]

**واتا : زاناکە ووتی : بەراستی تۆ هەرگیز ناتوانیت لەگەل منـدا خـۆراگر بیـت ،بیـدەنگ بیـت بەرامبـەر رەفتارو کردارم ،چونکە من شتی سەر سورهینەر دەکەم و تۆ لە نهینیەکەی تیناگەیت .. !! موسـی وەلامـی داوە ووتی : جا چۆن خۆدەگریت لە بەرامبەر شتیکەوە کە هوالت لی نیە و ئەم سەر و ئەو سەری نازانیـت .. موسی وەلامی داوە ووتی :دەمبینیت ئەگەر خوا ویستی لەسەر بیـت خـۆراگر دەبم و لـە هـیچ فـەرمانیکت دەرناچم ..!!**

**وە ئارامی گرتن لە دوای علیم و زانست دا ، دەر نەکردنی فتوا پیش بەیان کردنی پیگەی زانایان .**

**وە ئەو کاتەش دەچیتە ناو ئارامگرتنی مامۆستا لە سەر قوتابیە کەی ،دەبیت ئـارام بگریـت لەسـەر فـیر کردنەکەی ، بەسەختی تی بگات لە باسەکان ،وە بەدوا داچوون بکـات بـۆ لەبـەرکردن بەبیرهاتنـەوەی باسەکان و درەسە کان ئەوانەش پیویست ئارام بگرین لەسەری وە شتی تریش ..!!**

[٧٦] - سورة الكهف (٦٧-٦٨-٦٩).

## هۆكاره دامەزراوەكان يان تايبەتەكان لە سەر ئارامى گرتن

### ئارامى گرتن ديارى منە يان داهاتى منە ..؟!

بەلام زۆريك لە خەلكى كاتيك بەلاو نسبەتيكيان يان نەهامەتيەكيان بەسەر داديت ، ئە گەر ئامۆگارى بكريت ئەوا دەلى : خواى گەورە رۆژى ئارامگرتنى پينەبەخشوم لەسەر ئەو بەلاو نسيبەتە دا ، وە ئەگەريش فەرمانى پى بكەى بە جۆريك لە جۆرەكانى خوا پەرستى ،ئەوا دەلى :ئارامى پى نەدام لە سەريان ، ئەوا بەم شيوەيە رفتار دەكەن ..!!

وە ئەگەر باوەرت وابى ئارمى گرتن دياريە لە لايەن ( خواى گەورە ) ئەوان مرۆڤ يان ئادەميزاد ناتوانيت كۆ بكاتەوە يان پى بگات ..!!

وە ئەگەر وابيت ئارامى گرتن كۆناكريتەوە يان پى ناگەيت بۆ داهات ، دەبيت لەسەرى بوەستين لەبى توانايى لە پيش ئەو دەقەكانى كە فەرمانيان پى كراوە ، بەلام لە سوونەت دا وەلامى داوە تەوە سوود و خۆ رەوشتى ئارام گران بۆ گەيشتنى ، وەلە ( أبى سعيد خدرى ) – خوا لى رازى بيت – دەليت : پيغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى : (( ومن يتصبر يصبره الله )) . [٧٧] واتە : هەركەسيك ئارام بگرى ئەوا خواى گەورە ئارامى پى دەدات .

وە خەلكى تسليم بوون بەوەى كە لە بنچينەى دورست بوونياو هينانەديان هەنديكيان زۆر ئارام دەكرن بەردەوام و بە ئيرادەن وە زۆر تر ئارام گرتنە لە كەسانى تر ..!!

چونكە ئارامى گرتن كردەوەيە كى ( دڵ ) و دەروونە كە ئادەميزاد پەيوستى خۆى دەكات ، لەدواى ئاشتبوونەوە يان سازان لەگەل ( خواى گەورە ) بە بەزۆر كردنى راهينان و لەسەرى ، وەرزشيكى دەروونيە ، وە مەشق كردنە لەسەرى ، وە مجاهد يان اجتهادى دەروونى خۆى دەكات ، بە پشت بەستن بەم هۆكارانەى كە ئارامى گرتن لەسەرى دامەزراوە يان تاييەت كراوە پى ...!!

---

[٧٧] - صحيح البخاري (١٤٦٩).

## هۆكاره تايبەتەكانى ئارامى گرتن ؟!

### ١–هۆكاره تايبەتەكانى خۆگرى گرتن : زانين سروشتى ژيانى دونيا :

بى گومان ژيانى دونيا ئەگەر دەستى پيوه بگريت لەسەر كه چەندين سـەختى و بيـزارى تيـدا يـه ، وه ( خواى گەوره )كه ئادەميزادى دروست كردووه بەردەوام بۆ نارەحەتى و سەغلەتى و كيشەو ناخۆشى ،چـونكه ئادەميزاد زۆرخۆى ماندوو دەكات و زۆر رەنج و زەحمەت دەكيشيت ، سەر ئه نجاميش دەبى بگەريتەوه بۆ لاى پەروەردگار ..!! بى گومان زۆر ئيش ئازار دەر دەسەرى تەنگانه و تـاقى كردنەوه تووش ئـادەميزاد لـه سروشتى ژيانى دونيا دا ، وه ناكرين ئادەميزاد له ژيانى دوينا دا بەردەوام بيت ژيـان بكـات بـى ئـەوەى تووشى تاقى كردنەوه و تەنگانه نەبيت ..!!

بى گومان ئەو كەسەى ئەو راستەيەى يان ئەو حقيقەتەى ژيان نەزانيت ئەوا سەرى سـور دەمـينى لـه روو داوه كانى ژيان دا ، بەلام سەبارەت بەوەى كه له سروشت و ژيانى دونيا بزانى ئەوا لى تى بگه ،وه ئەگـەر به تاقى كردنەوەيەك گەيشت يان به تەنگانه يەك گەيشت ،ئەوا له ( دل ) ىخـۆى دا ئاسـانكارى بـۆ ده بيت له بەرانبەر ئەو فەرمانەى كه به سەرى دا هاتووه ..!!

## ٢–باوەڕ بوون بەوەی کە هەموو ژیانی دونیا مولکی (خوای گەورە ) یە :

وە ( خوای گەورە ) بە هەر کەسێك بیەوێت پێ دەبەخشێت ، وە بە هەر کەسێکیش بیەوێت پێ نادات ، هەروەك دەفەرمووێت ﴿وَمَا بِكُمْ مِنْ نِعْمَةٍ فَمِنَ اللَّهِ﴾ .[٧٨] واتا : هەرچی نازو نیعمەتێکمان هەیە هەر هەمووی بەهرەو بەخششی خوایە ..!! وە هەر بۆیە ئەگەر ئادەمیزاد لە شتێك دا قەدەغەکرا یان حرام بوو لەسەر ،ئەوا بە تاقی کردنەوەی کارە کە تێپەڕ دەبێت ..!! وە ئەوا ووتی ( أنا الله وإنا إليه راجعون ) : کە خوای گەورە دەفەرمووێت : ﴿الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُمْ مُصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾ .[٧٩] واتا : ئەوانەی هەر کاتێك تووشی بەلاو ناخۆشیەك دەبن دەلێن : ئێمە مولکی خوا ین و هەرچی هەمانە بەخششی خوایە ،سەر ئە نجامیش تەنها هە بۆ لای ئەو زاتە یە گەرانەوەمان ..!!

بێ گومان بەدە خۆی ماڵ و سامانی و خاو خێزانی مندلە کانی هەر هەمووی مولکی ( خوای گەورە ) یە ، بێ گومان ( خوای گەورە ) بەرووت قورتی مرۆڤی دروست کردووە ، وەخاونی ئەو رووتیەی ئادەمیزد کە رهاتێك بیەوێت ئەو رووتیە وەربگرێتەوە ئەوا وەری دەگرێتەوە بۆلای خۆی دەباتەوە ،وە ( أم سليم ) کاتێك کورە کەی لەدەست دا لەگەڵ ( ابو طلحة ) ئەوەهەلویستەی ئەو دوانە زۆر بە ناو بانگ و مشهورە ،وە کاتێك جەگەر گۆشە کەی خۆی لەدە ست دا کە چەند خۆشی دەوویست ووتی : ئایا تۆ هەلویستێ جۆن دەبێت کاتێك کەسێك ئەمانەتێك بدات بەکەسێکی تر، دوای داوی ئەو ئەمانەتەی لێ بکەن بۆ هەیە نەی دایداتەوە ؟!ووتی : نا ، ووتی : تۆیش ئەجرو پاداشتی کورەکە لە خوا بکە ..!! .[٨٠]

---

[٧٨] - سورة النحل (٥٣).
[٧٩] - سورة البقرة (١٥٣).
[٨٠] - صحيح مسلم برقم (٢١٤٤).

## ٣-زانینی سزاو پاداشتی ئارامی گرتن :

كه ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿نِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ  الَّذِينَ صَبَرُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ .[٨١]

واتا: ئای چەند جوانه پاداشتی ئشكەران بۆ خوا ..!! ئەوانەی خۆگربوون لەبەردەم ئەشكه نجه و ئازاری بی باوەراندا ز هەرپشت به پەروەردگاریان دەبەستن ..!!

وه ( ابن القيم ) – رەحمەتی خوای لی بیت – دەلیت : تیبینی /لەسەر باشی دەرئه نجامەكەی تایبەته به ئارامی گرتن .[٨٢]

و عن ( جابر ) رضي الله عنه قال : قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : (( يود اهل العافية يوم القيامة حين يعطي أهل البلاء الثوب لو ان جلودهم كانت قرضت في الدنيا بالمقاريض )) .[٨٣]

واتا: له ( جابر ) – خوا لی رازی بیت – دەلیت : پیغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی : ئەوانەی لەدونیادا جستەیان ساغ وسەلامەت بووە ،لەرۆژی قیامەت دا خۆزگە دە خوازن پیستەكەیان به مەقەس ببرایەتەوە ،له كاتیكدا پاداشتی بی شومار و زۆری ئەوانه دەبینن كه لەدونیادا خاوەن بەلاو دەردەدارو بەش مەینەت بوون ..!!

## ٤- نیازی ئارامی گرتن یان نەیەتی ئارامی گرتن :

وه ( عبدالواحد كوری زيد ) دەلیت : هەر كەسیك نیازو نیەتی ئارام گرتنی یان خۆگری هەبیت لە سەر فەرمان و واجب و طاعه تەكانی خوای گەورە دا ، ئەوا خوای گەورە زالی دە كات بەسەری دا ، وه هەر كەسیك نیاز نیەتی ئارامگرتنی هەبیت له گوناهو تاوان و خرا پەكاری نەیكات لەبەر ( خوای گەورە ) دا ئەوا ( خوای گەورە ) پا پشتی دەكات و دەپاریزی له خرا په كاری ..!! .[٨٤]

---

[٨١]- سورة العنكبوت (٥٨- ٥٩).
[٨٢] -ابن اقيم مدارج السالكين (١٦٧/٢).
[٨٣] سنن الترمذي برقم (٢٤٠٢ ).
[٨٤] - حلية الأولياء (١٦٣/٦).

## ٥–دلنیابی لەوەی کە دەگەیت بەخۆشی و شادی :

چونکە ( خوای گەورە ) لەگەل هەموو ناخۆشیەك ، خۆشی شادی بەدوا دادەهینی ، ئەوەشی ناخۆشیە رەحمەتی پەروەردگارا ..!! کە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا (٥) إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا﴾ .[85] واتا : بەراستی هاوری لەگەل تەنگانە دا خۆشی و ئاسوودەیی دیت ،بی گومان بە دلنیاییەوە هاوری لەگەل تەنگانەدا خۆشی ئاسوودەی هەر دەبیت ..!!

بی گوما ( خوای گەورە ) هیزو پالپشتی خۆی رەوان دەکات لەسەر چارە نووس قەدر و بەلاو نسیبەت ، وە ئەو زاتە هیچ کات پەیمان ناشکینی هەر دەیهینیتە دی یان ( خوای گەورە ) زاتیك نیە کە بەلین و پەیمانی خۆی نەباتەسەر ..!! هەروەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَلَا يَسْتَخِفَّنَّكَ الَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ﴾.[86] واتا : جا ئەی ﷺ ئەی ئیمانداران دان بە خۆ دا بگرەو ئارام بگرە ،چونکە بی گومان وەعد و پەیمانی و بەلینی خوا حەق و راستە وە هەر دیتە دی ئەوانەش کە باوەریان نیە بی ئارامت نەکەن وەساردت نەکەنەوە ..!!

وە هەروەها پیغەمبەر ( یعقوب ) – علیە السلام ) ئارامی گرت لەسەر لەدەست دانی ( یوسف ) – علیە السلام – و ە دوو لە کورە کانی ..!! ئینجا فەرمووی : ﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ﴾.[87]واتە : ووتی جا ئارام دەگرم بە ئارام گرتنیکی جوان پەسەند ..!! چونکە یعقوب – علیە السلام – توورە نەبوو ،وە جگە لە ئارامی گرتن هیچی تری نەکرد ..!!

[85] - سورة الشرح (٥-٦).
[86] - سورة الروم (٦٠) .
[87] - سورة يوسف (١٨).

هەروەها ( يعقوب ) – عليه السلام – دەردو خەفەت وساكالاى خۆى راستە خۆ گەياندە لاى ( خواى گەورە ) ، كە دەفەرموويت : ﴿قَالَ إِنَّمَا أَشْكُو بَثِّي وَحُزْنِي إِلَى اللَّهِ وَأَعْلَمُ مِنَ اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ . [٨٨]

واتا : لەوەلامدا ووتى : بەراستى من باسى سكالاو غەم و خەفەت و پەژارەم هەر بۆلاى خوا دەبەم ، ئەوەى من دەيزانم لە لايەن خواوە لە نخشەو و حيكمەتەكانى لە پيشهات و رووداوەكاندا ئيوە نايزانن ..!!

بە لى ( يعقوب ) – عليه السلام – ساكالاى خۆى نەبردە لاى هيچ لەدروست كراوە كانى ( خواى گەورە ) بەلكو راستەو خۆ ساكالاو خەم و پەژارە كەى بردە بۆلاى ( خواى گەورە ) چونكە باوەرى وابوو هەر ئەو زاتە دەتوانيت خۆشى شادى بۆ بگەرينيتەوە ، هەر واش بوو كە هەموو خانەوادە كەى كۆ كردەوە بە يەكى گەياندن لە سەر ئە نجامدا ..؟!

## ٦–وە لە تايبەتمەنديە كانى ئارامى گرتن : پشت بەست بە(خواى گەورە ):

كە ئەويش پەناگرتن وپارستن و دواى پالپشتى كردن لە ( خواى گەور ) يە كە دەفەرموويت : ﴿وَاصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِاللَّهِ﴾. [٨٩]

واتا : ئەى پيغەمبەرى خوا ﷺ ئەى ئيماندارا خۆگرو ئارامگربەو خۆگرى و ئارامگريە كەشت تەنها بەكۆمەكى و يارمەتى خوا دەبيت بەكەسى تر ناكريت ..!!

وە ( ابن كثير ) دەليت : ئەو هەواڵە ئەوە دەگەيەنيت ، كە ئارام گرى خۆراگرى بەدەست نايەت تەنها بەيارمەتى ويست و تواناو دەسەلاتى خواى گەورە نەبيت ..!! . [٩٠]

---

[٨٨] سورة يوسف (٨٦).
[٨٩] - سورة النحل (١٢٧).
[٩٠] -ابن كثير في تفسير القران العظيم (٢/٧٨١).

## ٧- ئیمان هینان به چاره نووس و قه‌ده‌ری خوا :

ئه‌ووش یه‌کیکه له تاییه‌ت مه‌ندیه‌گه‌وره کانی ئارامی گرتن ، وه بی گومان مرۆڤ ده زانین که قه‌زاو قه‌ده‌رو چاره‌نووس زۆر کاریگه‌ره ،وه له‌لایه‌ن خوا وه‌یه ،وه ده‌بیت مرۆڤ پابه‌ندی بیت یان خۆ به‌ده‌سته‌وه‌بدات ،وه قه‌زاو قه‌ده‌ر له به‌رانبه‌ری دا بی ده‌سه‌هه‌لاتی ..!! هه‌روه‌ك ( خوای گه‌وره ) ده‌فه‌رموویت : ﴿مَا أَصَابَ مِنْ مُصِيبَةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي أَنْفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَابٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ نَبْرَأَهَا إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾ .[٩١]

واتا : هیچ به‌لاو نسبه‌ت و رووداویك له‌زه‌ویدا ،بۆتان پیش نه‌هاتووه که له ( لوح المحفوظ ) دا تۆمار مان نه کرد بیت ، پیش ئه‌وه‌ی رووداوه که پیش بیت ، ئه‌و کاره‌ش بۆ خوا رۆز ئاسانه ..!!

له پاشاندا ره‌هه‌نده‌که ئه‌وه ده‌گه‌یه‌نی که دله راوکیه کی زۆر به‌ترسه‌وه پاساو هینانه‌وه و داوای لیبووردن کردن ناره‌زای ده‌ر برین و سکالا کردن ، به‌لام سه‌ر ئه نجامی ئه‌و هه‌موو ده‌ر برینه ، نه‌هیچ شتیك دووباره ده‌بیته‌وه نه‌ده‌ش گه‌ریته‌وه نه‌ماوه‌ش یان وونه ، وه که‌سی هۆشمه‌ند بۆ ئه‌و جۆره ناخۆشیانه دا ده‌بیت چاره سه‌ریه که‌ی ته‌نها و ته‌نها به ئارام گرتن بیت ، به‌لام به پیچه‌وانه‌وه که‌سی نه‌فام و گیل و نه‌زان به‌م شیوه‌یه بیر ناکاته‌وه ، وه له کاتی رووداونی هه‌ر به‌لاو نسیبه‌تیك دا ئه‌وا ده ترسیت بیزاری خۆی ده‌ر ده‌بریت بۆ هه‌ر به‌لان نسیبه‌تیك سکالا ده‌کات دله راوکیه‌کی زۆری تووش ده‌بیت ، له‌کاتیك له مال و دارایی ماوه نه ئه‌وه‌ی له‌ده‌ستی داوه ده‌گه‌ریته‌وه ،به‌لام له دوای هه‌ر نه‌هامه‌تیه‌ك ده‌رد به‌لایه‌ك ده‌بیت ئارام بگرین ، وه ئه‌گه‌ر ئارام گرتن له چرکه ساتی یه‌که‌م دا هه‌بیت ئه‌وا خیرو حیکمه‌تی زۆر زیاتر ده‌بیت.

[٩١] - سورة الحديد (٢٢).

## ٨–ناسینی تاقی کردنەوەکان بەلاو نەهامەتیە کان :

ئەوە رەمزی چاکە کردنی بەندەیە بۆ تاقی کردننەوە لەسەر بە هێزی بەگوێرەی بەلاو نسیەتەکەی دا ،

وە لە ( سعد ) – خوا لێ رازی بێت دەڵێت : ووتم : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چ خەڵکانێك یان کێنە ئەوانە ی تۆشی سەخترین بەلاو سنیەبت دە بن ..؟؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( الأنبياء ثم فالأمثل فيبتلى الرجل علة حسب ينه ، فإن كان دينه صلبا أشتد بلاؤه ،وإن كان في دينه رقة ابتلي على حسب دينه ،فما يبرح البلاء بالعبدي حتى يتركه على الأرض ما عليه خطيئة )) .[٩٢]

واتا: ووتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کێن ئەوانەی تووشی سەخترین تاقی کردنەوە دەبن و بەلاو مەینەتی روویان تێ دە کات ..؟! ئەویش فەرمووی : پێغەمبەران لە پاشدا شایستە ترو شایستە تر ، هەرکەسی بەگوێرە ی دینداری خۆی تاقی دەکرێتەوە و تووشی بەلاو مەینەیتی دەبی ، ئەگەر دینداریەکەیدا بەهێز بوو تاقی کردنەوە کەی توندتر و گرانترە دەبی ، ئە گەر نەرم نیانی لە دینداریە کەیدا هەبوو بە پێ ئەوە تاقی دەکرێتەوە ، ئەو تاقی کردنەوەش بەردەوام لەکۆڵی بەندە نابنەوە هەتا بەسەر زەویدا دەروات و گوناهی نامێنێ ..!! واتە : تاقی کردنەوە کانی بەلاو مەینەتی گوناهو تاوان دەسرنەوە ..؟!

[٩٢] - سنن الترمذ برقم (٢٣٩٨).

## تیرمان لە چیرۆكی ئارامگرەكان

بی گومان تیرمان یان چاو لی كردن لە چیرۆكی ئە كەسانەی كە لە پیشدا ئارام گرو خۆراگر بووینە ئەوا ئەو چاو لی كردن تیرمانە، گەورەترین هۆكاری سەركەوتنە بۆ ئارام گرتن یان یەكیكە لە هۆكارە تایبەتەكانی سەركەوتنی ئارام گران و خۆگران ،چونكە تیرمان چاولی كردن لە پیشینەكان چاكەكان سوودیكی یەكجار بە ئەوكەسانەدە بە خشیت كە تووشی بەلاو نسیبەت نەهامەتی دەرد ناخۆش دەبن ، بی گومان وەك چرۆكی پیغەمبەران ( علیە السلام ) بۆنموونە ،چونكە ئەو چیرۆكانی پیغەمبەران ( علیە السلام ) وەك قوتا بخانە وایە بۆ فیر بوونی دەرس وانە پەندو ئامۆژگاری ، بۆ ئەوەی ئادەمیزاد لە راست و دروستی یان حقیقەتی ئارام گرتن تی بگات بۆی روون بیتەوە كە ئارام گرتن چ سوودیكی هەیە بۆی ، بی گومان ئەوەی كە راستە ئەوەیە پیغەمبەران ( علیە السلام ) هەر هەموویان تووشی نەهامەتی دەر دو نەخۆشی ئازارو ئەشكەنچە ئیش ژان ، وە لەدەست دانی مال سامان كەسە نزیكە كانیان هاتوون ، بەلی پیغەمبەران هەر هەموویان ئادەمیزاد بوونە پیش ئەوەی پەیامی پیغەمبەرایەتی بۆ هاتبیت لەدوای پەیامەكەش هەر هەموویان ئادەمیزاد بوونە ،وەك مرۆڤیكی ئاسایی تووشی دەردو ناخۆشی بوونە ئارامیان گرتووە لەسەری ، وەجیاوازی پیغەمبەران لە گەل ئیمە دا تەنها وەحی نیگایە ، ئەوش بە هەموو پیغەمبەران دراوە بۆ ئەوەی گەل و هۆزەكانیان ئاگادار بكەنەوە بۆ یەكخوا پەرستی راست و درووست وە دوور كەتنەوە لە خرا پە كاری ،فەرمان كردن بەچاكە كاری ،لە سەر ئەو بانگەوازیە ی پەیامی خوای گەورە بی گومان تووشی زۆر ئەشكەنچە و ناخۆشی جستەی و دەروونی بوونەتەوە ،یان دوور كراونەتەوە لەوەلات كەس كارە كەیان ،یان بە ئازار پیغەمبەرانیان شەهید كردووە ،وە ك نەوەی ئیسرائیل زۆر لە پیغەمبەرانیان شەهید كردووە ، وە یان بانگەوازی پیاو چاكان لەسەر ئاینی خوا ،لە سەردمەكاندا زۆریك لە زانیان و پیاوچاكان تووشی نەهامەتی هاتوونە لەسەر ئەم ئاینە پاكە ،ئەمەشە نموونەی زۆرن لە پیاو چاكان دا ، وە یان پیغەمبەری ﷺ ئاخر زمان كۆتا پیغەمبەر ﷺ كە رۆشنای چاوی جیهان رحمە للعالمین ،سەروەرو پشەواوی موسلمان زۆر ئەشكەنچەو ئازاری جیشتووە بەدەستی كافرانی قوریش شاری تایف و هەروەها دەربەدەر كردنی لەشاری خۆی كۆچ كردنی بۆ مەدینە،وە ئازارو ئەشكەنچەی هاوەلانی پیغەمبەری خوا ﷺ ئەمانە هەموو نموونەی كەسانیكی كە ئارامیان گرتووە لە سەر ئەونەهامەتیانەی كە تووشیان هاتووە ئیمەش بەكورتی باسی هەنەدیك لەو نموونانەدەكەی بە پیشتیوانی خوا ..!!

## یەکەم (نوح) (علیه السلام )

بەلی لەگەل قەوم و هۆزەکەی ئارامی گرت لەسەر بانگەوازیە کەی بە ئارامگرتنیکی گەورە بەردەوام بوو هەزار سال تەنها پەنچا سال نەبیت ، وە جیهاد و تی کۆشانی کرد لە بانگەوازیەکەی دا ، ئارامی گرت لەسەر ئازار و ئەشکەنچەی جستەیی و دەروونی دا ، بی گومان تۆمەتبارایین کرد بەوەی کە ئەو پیاوە شیتەو وە گومرا بووە ، ئەویش بەرانبەر بەم هەموو نەهامەتیەی کە تووشیان کرد ئارامی گرت ، کە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿قَالُوا لَئِنْ لَمْ تَنْتَهِ يَا نُوحُ لَتَكُونَنَّ مِنَ الْمَرْجُومِينَ﴾ .[٩٣]

واتا :ئەوسا دەسەلاتداران ووتیان : ئەی نوح ئەگەر کۆل نەدەیت و کۆتایی بەم باسانە نەهینیت ،بەراستی لە رجم کراوان ، دەبیت ( بەرد بارانت دەکەین )..!!

[٩٣] - سورة الشعراء (١١٦).

## دووەم : (إبراهيم ) (عليه السلام ) :

بەلی ( إبراهيم ) ( عليه السلام ) تووشی تەنگانەوناخۆشی ترس وبیمەی زۆر بوو ، کاتێك فریدرایە یان هاویشتیانە ناو ئاگر ، تەنها ئەو دوعاو نزایەی کرد لە کۆتا قەسەی دا ، کە( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ( حسبی الله ونعم الوكيل ) .[٩٤] واتە : خودام بەسە پاشترین پشت پەنامە و بەس ..!!

وە کاتێك فەرمان لەلایەن ( خوای گەورە ) دەرا بەسەر ( إبراهيم ) ( عليه السلام ) بە سەر بڕینی جگەر گۆشەکە یان کورە کەی دا ،وە خەفەتی لە ( دڵ )وە خوارد بەلام ئارام وگۆراگر بوو بۆ فەرمانەکەی ( خوای گەورە ) بەسەر بڕینی جگەر گۆشەکەی ، دەستی دایە چەقۆ بۆ سەربڕینی کورەکە ، وە کورەکەی پاڵ کەوت و درێژ بوو بۆ ئەوەی باوکی سەری بڕیت فەرمانەکەی ( خوای گەورە ) جی بەجی بکات ،ئەوە کە زۆر ئارام گر بوو خۆراگر بوو بۆ ئەوەی تەسلیمی فەرمانی ( خوای گەورە ) بیت ، هەروەها ( إبراهيم ) فەرمانی پیکرا کە خاوخیزانەکەی یان ژن و مندالەکەی بەجی بهیلیت لەو زەویە کە بی ئاو بی خۆراك بوو ، زەویەکی ووشك بوو هیچ بەروبوومیکی لی نەبوو بۆ ئەوەی تیدا بژین بینەوە ، بەلام ( إبراهيم ) ژنە کەی و مندالەکەی کە ( هاجر ) و ( إسيماعيل ) بوون بەجی هیشت لەم زەویەدا ، لە کاتێك دا ( هاجر ) تازە کورە کەی لەدایك ببوو کە ( إسماعيل ) ( عليه السلام ) ، لەکاتێك دا ( إبراهيم ) ( عليه السلام ) نەزۆك بوو دوای چەند سال ( خوای گەورە ) ( إسماعيل ) ی پیبەخشی لەدایك بوو ، لە کاتەدا ئەو تەمەنی گەیشتبوو بە سەرووی ( ٥٠ ) سالیدا ، ئا لە و کاتەدا زۆر پیویستی بە ژن مندالە کەی دا هەبوو بۆ چاودیری کردنیان ، لەسەرووی هەموو ئەو نەهامەتی ناخۆشیانە فەرمانەی کە پیدرا بوو ،ئەوا ئە پیغەمبەرە نازدارە پایە کاتێك دا ( هاجر ) خیزانی پی ووت : بۆچی واز لە ئیمە دەهینی دەرۆیت بەجیمان دەهیلی لەم دۆلە دا ، لە کاتێك دا نە مرۆڤی لی یە نەهیچ شتێك ،( هاجر ) پی ووت : چەند جار ئەو قسەیە دوو بارە دەکەمەوە بۆ روومو تیناکەیت ، وە ( هاجر ) ووتی : ئایا ئەوە فەرمانی ( خوای گەورەیە ..؟! ( إبراهيم ) ووتی : بەلی.( هاجر ) ووتی : کەواتە ئیمە بە فیرۆ مەدە یان لەدەسمان مەدە ..!! .[٩٥]

وە کاتێك ( إبراهيم ) گەرایەوبۆ وەلاتی شام ، ( خوای گەورە ) رزق رۆزی بۆ هینا ( سارە ) کردە هاوسەری لە ( سارە ) ( إسحاق ) ( عليه السلام ) پی بەخش ولە ( إسحاق ) یش ( يعقوبی ) پی بەخش ، وە ( خوای گەورە ) نیعمەتی ئاوی زمزمی دا بە ( إسماعيل ) و دایکی ( هاجر ) وە چەندین نیعمەتی تریشی پیدان ...!! .

[٩٤] - صحيح البخاري (٤٢٨٨).
[٩٥] -رواه البخاري برقم (٣٣٦٤).

## سی یەم : (موسی) (علیه السلام ) :

بی گومان ( موسی ) ( علیه السلام ) زۆر ئازارو هەرەشەی لـی کـرا ،لـە لایـەن فیرعـەون قەومەکـەی ، وە تەنانەت لە لایان قەومەکەی خۆشی کە نەوەی ئیسرائیل بوون ،بەلی ( موسی ) ( علیه السلام ) ئارامی گرت لە بانگەوازیە کەی لەسەر هەردوو قەومەکەدا ، وە ئارامی گرت لە بانگەوازیە کەی کە لە لایەن فیرعـەون ئاینەکەی ( موسی ) گۆشە گیر کرا بوو ، وە ئازارو هەرەشەی لی دە کرا لەسەر بانگەوازیە کـەی ،هـە تـاکو ئەوە بوو ( خوای گەورە ) فیرعەون قەومەکەی لەناوبرد تووشی هیلاکی کردن ، پاشان ئارامی گرت لەسـەر قەومەکەی خۆی کە زۆر ئازاریان دەدا و زۆر دوا کاریان لی هەبوو ئەویش نەوەی ئیسرائیل بوون ..!!

لە( عبداللە کوری مسعود ) – خوا لی رازی بیت – لە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : یادی ئـازاری براتـان ( موسی ) بیرتـان بخەمەوە ،فەرمووی : کە ( خوای گەورە ) رەحم و میهرەبانی خۆی رژانەدە بەسەر ( موسی ) کە بەو ئازارە ی بۆی هاتە لە فیرعەون هەردوو قەومەکەدا، زیاتر لەوە صبرو ئارامی پی بەخشی ..!! .[96]

## چوارەم : (عیسی ) (علیه السلام ) :

( عیسی ) ( علیه السلام ) زۆر ئازاری چەشت بە دەست قەومی نەوەی ئیسـرائیل ،تۆمـەتباریان دەکـرد کـە بەکەسیکی باتل و فاسد ، وە فەرمانی بەسەر درا کەلە لایەن قەومی نەوەی ئیسرائیل ، بەکوشتن لە خـاچ دان ، وە بەلام ئارامی گرت تا وەکو ( خوای گەورە ) بەرزی کردەوە بۆ لای خۆی ..!!

[96] - رواه مسلم (برقم (١٠٦٢).

## پینچەم : کۆتاپێغەمبەر ﷺ :

بەلی پێغەمبەری خوا ﷺ چەندی جار گۆشە گیریان کرد و ئازاریان دا لە لایەن قەومەکەی کە کافرانی قریش بوون ، دەیان ووت : ئەو پیاوە شیت ، جادوو گەرە ، درۆزنە ، ناپاکە ، لەراستی دا لە ناو قەومەکەی بەرست گۆ ناسراوە بوو ، بەلام تۆمەتباریان دەکرد و بوختانیان پی دە کرد ئەیان ووت : درۆزنە ..!! لەراستی دا ئەو لە هەموو قەومەکەی دا هۆشمەندو بیرمەند ترو عاقل تر بوو ، بولام تۆمەتباریان دەکردو بوختانیان پی دەکرد کە شیت بووە ..!!وە لەراستی دا لە ناو قەومەکەی بە دەست پاك ئەمین ناوی دەرکرا بوو ، بەلام تۆمەتباریان دەکرد و بوختانیان پی دەکرد کە ناپاك و نا ئەمینە..!!

لە راستی دا ئیمانداریکی راست دورست باوەر دار بوو بەو زاتە الله ی تاك و تەنها ، بەلام تۆمەتباریان دەکرد و بوختانیان پی دە کرد ، کە جادوو گەرە شیتە و شاعیرە ، لە سەرووی هەموو راستیە کان دا پیغەمبەری خوا کامل تەواو بوو لە رووی رەوشت بەرزی راستگۆیی و هۆشمەندیەوە ..!!

پیغەمبەری خوا ماندوو بوو بەدەست قەومەکەی دا ،تا ئەوە بوو بریار بدە دەربچیت لە وەلاتەکەی یان لەشارە کەی کە شاری مککە بوو کۆچ بە کات بە فەرمانی ( خوای گەورە ) بۆ شاری مەدینە ، شوینی لەدایك بوونی خۆی بە جیهیشت ، سەرە رای ئەو هەموو ئازارەش فەرمان کرا لە لایەن کافرانی قریش بەکوشتنی ﷺ ..؟! کە ( خوای گەورە ) دفەرموویت : ﴿وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ﴾.[٩٧]

واتا: ئەی ﷺ یادی ئەو کاتە بکەرەوە کاتیك ئەوانەی بی باوەر بوون پیلانیان دەگیرا دژی تۆ بۆ ئەوەی زیندانیت بکەن ، یان بتکوژن ، یان دەرت بکەن ،ئەوانە پیلان خۆیان دەگیرن و خوایش پیلانی خۆی دەخاتەکار و بە پووچ کردنەوەی کارە کانیان ،دلنیابن ( خوای گەورە ) چاکترینی هەموو پیلانسازو نەخشە سازانە، نایەلی پیلانیان سەر بگری ..!!

[٩٧] - سورة الانال (٣٠).

بەلی چەندین کس لە هاوەلانی پیغەمبەر ﷺ شەهید کران ئازاریان پیگەیشت ،تەنانەت زۆر بەتوندی ئازاریان دەدان ئەوانەی شوینکەوتووی پیغەمبەری خوا ﷺ گۆشەگیریان کردبوون و دەیان شەهیدیان دەکردن لە بەر چاوی پیغەمبەری خوا ﷺ ، تەنانەت لە کاتیك دا پیغەمبەری خوا ﷺ تیپەری بەلای ( یاسر ، سمیە ) بەوانی فەرموو (( ئارام بگرن ئەی نەوەی ( یاسر ) ، لە بەهەشت دا چاوە ریتان دەکەم یان لە بەهەشت دا بە یەك دەگەین ..!! .[٩٨]

وە کاتیك کە کۆچی کرد بۆ شاری مەدینە ، زۆر ئازاری چەشت بەدەست دوو رووەکانی ئازارەکە زۆر گەورە بوو ، یەکیك لەو ئازارە دەروونیانە ئەوە بوو کە پی دەوتریت ( حادثة الإفك ) ئەو رووداوە پیغەمبەری خوا ﷺ زۆر دل گران کرد چونکە ( عائیشەکچی ابو بکر ) کە هاوسەری پیغەمبەری خوا ﷺ بوو ،وە دایکی ئیمانداران تۆمەتبار کرا بە ( زینا ) کرد ، ئەوەش بوختانیکی یەکجار گەورە بوو لە لایەن نا پاك دوو رووە کانی شاری مەدینە، پیغەمبەری خوا ﷺ صبر ئارامی لەسەر گرت ،لە لایەکی تریشەوە لەدەست فیل تەلەکەی جوولەکەکانی شاری مەدینە ،ئەویش زۆر ئازار درا ،لە کاتیك دا ئەوانیش هەولی شەهید کردنی پیغەمبەری خوا ﷺ دا ، لەلایەن ژنیکی جوولەکەوە کە دعوتی کرد و بەرخیکی بۆ سەر بری ژەهری بەسەر رانی برخەکەدا بۆ ئەوی پیغەمبەری خوا ﷺ شەهیدی بکات بی کوژی ، ئەلین هە تا پیغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد بەدەست ئیش ژانی ئەو ژەهرە ئازاری بی دەگەیشت بە جستەی ،وە ئەلین ئەووەش هۆکاری بوو بە وەفات کردنی پیغەمبەر ﷺ کە چارەنووس ئەجەلی کۆتایی پی هینا ( خوای گەورە زاناتر ).

وە ئەو ئارام گتنی پیغەمبەری خوا ﷺ بوو ، هەتاکو ( خوای گەوە ) بیرو باوەریکی بەرزی پی بەخشی ،بۆ ئەوەی پەیامەکە و ئەمانە تکەی بە جوانترین شیوە بەگەیەنی ..!!

[٩٨] - رواه الحاكم برقم (٥٦٦٦).

## شەشەم : ئازار چیشتنی هاوەڵاکانی شوین کەوتووەکانی پیغەمبەری خوا ﷺ:

وەك ( بلال ) ،( سمیە ) ، ( صهیب ) ، ( عمار ) ، ( مقداد ) ، ( خبیب ) ئەوانە ئەشکەنجـە دران بـە هـەموو جۆرەکانی ئازارو ئەشکەنجە دان ، بەلام صبر ئاراميان و خۆراگریان لەسەر گـرت، بـۆ نموونـە ( خبیـب ) ئەشکەنجە درا بە ئیش و ئازاریکی زۆر و زیندانی لە خاچ درا تاکو شەهید کـرا ، وە نموونەیـەکی تـر لـە شـوین کـەوتوەکانی هـاوەلانی پیغەمبـەری خـوا ﷺ (( عـروە کـوری زبـیر ) یـەکیك بـوو لـە گـەورە پیاوچاکەکانی شوین کەوتوان ، وە ( احمد کوری نصر الخزاعی ) یەکیك بوو لە گەورە زانایان سلف ئـەو بوو ئەوانەی دەیان ووت قرانی پیرۆز درەست کراوە ، ئەوان سەریان بری ، لە شـاری بغـداد ، وە یـەکیکی تریش لە زانایان ( ئیمامی احمد کوری حنبل ) بەرانبەر بە ئازاردانی دەروونـی ئەوانـەدەیان ووت قرانـی پیرۆز دروست کراوە ..!!

بەلی ئەوانەی کە لە هاوەلان و شوین کەوتووان زانایانی سلف ،هـەر هـەموویان ئـازار دراون ئەشکەنجـە دراوە لە لایەن ئەوانەی کە زالم ستەمکار بوون ،چونکە ئەوانە فەرمانیان دەکرد بەچاکە و نەهی شـیان دە کرد لە خراپە کاری ، بی گومان زالم ستەم کارو کاربەدەستی فاسق گەندەل ، لە بەرژەونـدی دەدریـت کـە کەسکی فەرمان بە چاکە بکاتوە نهی لەخراپە بکات ، بەلام سەرووی هـەموو ئـازارو ئەشکەنجـە نـاخۆش نەهامەتی کە بەسریان دا هـات هـەر ئاراميـان گـرت خـۆراگر بـوون ،دریـژەیان بـە بانگـەوازی حـەق راستەخۆیان دا بۆ ئەوەی ئەو ئاینە راست دورست بە ئیمە بگات ، دیارە لە هەموو سەردەمیك ئاینی ئیسلام دژی زۆر داری خراپە کاری بووە ، هەر بۆیە لە لایەن فەرمانرەواو کار بەدەسـت زالم سـتەکارانەوە ئـاینی ئیسلام یان گۆشە گیر کردووە ، رقیان لەو کەسانەیە کە پەیرەی ئاینی ئیسلام دەکەن ، بەلام ئەوانەی کـە باوەریان بەهیز و دامەزراوە بەردەوام بن لەسەر بانگەوازی ئاینی ئیلام ئەگەر بە ووشەیەکیش بیت با بـلاو بیتەوە بۆ هەموو جیهان سوود ئامۆژگاری لە م ئاینە پاکە وەر بگرن ، بی گومان لە سەرتا ووتمـان دەبیـت ئارام بگرین لەسە رهەموو ئەو نەهامەتیانەی کەدیتە ریگەمان جا چ بۆ ژیانی رۆژانەمان بیـت یـان چ بـۆ بانگەوازی بیت ، ئارام گرتن سوود بە نەفس خۆت دەگـەینی وە سـوود بـە بانگـەوازی ئـاینی ئیسـلامیش دەگەینی ، لە ( خوای گەورە ) دەپاریمەوە کە ئارامی و خۆگریمان پی ببخشە وە ك ئـەوەی بە پیغەمبـەران ( علیە السلام ) و ، هاوەلان _ خو الی یان رازی بیت ) و ، زانایان – رەحمەتی خوا یان لی بیت _ بەخشیوە بە ئیمەش ببەخشە لەسەر بانگەوازی لەریگای خوا دا بمان پاریزە لە فتنەی زالم وستەمکاران ..!!

## ئەونەهامەتیانەی یان ئەوکارە زیان بەخشانەی پیچەوانەی ئارام گرتنن :

هەموو کردەوەیە لە کردەوەکانی خیرو چاکە روو بەرووی هەندیك سزا افات نەهامەتی زیان بەخشی دەبنەوە ،کە لەو ریگایە دا دەوستین ،وە ریگری لە ئیماندار بکریت بەردەوام نەبی لە لایەنەکانی ،بۆ ئەوەی وینەی خۆی بەدەست بهینی ، یان لیکۆلینەوە لەوینەی خۆی دا بکات ، وە لە ریگای ئارامی گرتن هەندیك لە نەهامەتی زیان بەخشین هەیە ، کە پیچەوانەی ئارامی گرتنە ،ئەمانە :

### ١-(پەلەکردن یان پەلەیی ):

چونکە مرۆڤ بە سروشتی خۆی خۆی بەوە گرتووە کە پەلە بکات ، چونکە ( خوای گەور ) مرۆڤی دروست کردووە لەسەر ئەو وینەیە کە دەفەرموویت: ﴿خُلِقَ الْإِنْسَانُ مِنْ عَجَلٍ﴾ . [٩٩]

واتا: ئەوەندە ئادەمیزاد بە پەلە عەجوولە ، هەردەلی لە پەلەو عەجوول درست کراوە ..!!

لەسەر ئادەمیزاد پیویست ئارامی هەبیت بۆ گەیشتن بۆ سەر بەرهەمەکەی یان ئەو شتەی کە دەیەویت ، هەروە ك ( خوای گەورە ) فەرمانی بە پیغەمبەرە کەی کردووە نابیت پەلە بکەیت ، کە یەکیك لە پیغەمبەرانی ئەول عزم بووە ، کە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُولُو الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ وَلَا تَسْتَعْجِلْ لَهُمْ﴾ . [١٠٠] واتا: کەوا بوو ئەی پیغەمبەرﷺ دان بەخۆتان بگرە وئارام بگرە خۆراگر بە ، هەر وەك پیغەمبەرانی خاون ویست بەهیز خۆراگر بوون ، پەلەشیان لی مەکە ..!!

لە بەر ئەوەی زۆریك لە بانگەواز کاران هەول و توانای بی سوود بووە زیانی پی گەیشتووە شکستی هیناوە لە بانگەوازیە کە بۆ چاکە کاری و چاك سازی ، چونکە ئەوانە لەو کەسانەن کە زۆر پەلەیان کردووە لە بانگەوازی کردن هەموو بەرهەمەکانیان کۆتایی پی هیناوە وە گرنیگی پی نەدراوە ..!!

بی گومان ئەگەر بانگەوازی بکەین دەبیت پەلە نەکەین لە بانگەوازیە کە ،دەبیت بانگەوازیەکی راست دروست بی کەم کوری بیت ، هەلن خەلەتین بە قەسەی ناحەزانی ئیسلام ئەوانەی بیدعە کارن ، خۆ مان بپاریزین لە ووتەی ئەم ئەو تەنها پشت بە قورئان و فەرمووده راست دروست کانی پیغەمبەری خوا ﷺ زانایانی سلف ببەستین ..!!

---

[٩٩] - سورة الانبياء (٣٧) .
[١٠٠] - سورة الاحقاف (٣٥).

## ٢- (توورەیی) یەکیکە نەهامەتی زیان بەخشی کە پیچەوانەی ئارامی گرتنە :

دەبیت زۆر ئاگادار بین کـە تـووڕە نـەبین ، چـونکە پیچـەوانەی ئـارامی گرتنـە ، کـە ( خـوای گـەورە ) پیغەمبەرەکەی ﷺ ئائادار دەکاتەوە لە تـووڕە بـوون ، کـە دەفـەرموویت ﴿فَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُنْ كَصَاحِبِ الْحُوتِ إِذْ نَادَى وَهُوَ مَكْظُومٌ﴾ . [١٠١]

واتـا : ئەی ﷺ تۆ خۆراگر بە لە بەرانبـەر فـەرمانی پەروەردگارتـەوە ، نەکـەیت وە هـاوەڵ و خـاوەنی نەهەنگ کە بیت ،(یونس پیغەمبەر بوو -علیه السلام - ) لـە کاتیـك کـە دڵـی پـر بـوو لـە خەفـەت و پەژارەیەکی زۆرەوە پارایەوەو لا لایە وە ..!!

## ٣-بی هیوایی ، ئەوەش پیچەوانەی ئارامی گرتنە :

چونکە بی هیوایی بەر بەستیکە لە بەربەستەگەورە کانی ئارامی گرتن ، هەر بۆیە ( یعقوب ) ( علیه السلام ) مندالە کانی لەوە ئاگادار کردەوە کە بی هیوا نەبن بە حیکمەت رەحمـەت سـۆز و بـەزەیی و میهرەبـانی ( خوای گەورە ) ، هەر وەك ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿يَا بَنِيَّ اذْهَبُوا فَتَحَسَّسُوا مِنْ يُوسُفَ وَأَخِيهِ وَلَا تَيْئَسُوا مِنْ رَوْحِ اللَّهِ إِنَّهُ لَا يَيْئَسُ مِنْ رَوْحِ اللَّهِ إِلَّا الْقَوْمُ الْكَافِرُونَ﴾ . [١٠٢] واتـا : دوای چەند رۆژیك ( یعقوب ) ( علیه السلام ) فەرمانی دا بەکورەکانی ووتی : کورەکانم بچنەوە و گـویی بگـرن بـۆ ( یوسـف ) ( علیـه السلام ) و براکەی ، لە سۆزو میهرەبانی خوایش نائومید و بی هیوا مەبن ، چونکە بەراستی کەس نائومیـد و بی هیوا نابیت لە سۆزو میهرەبانی خوا جگە لە کەسانی خوانە ناس و بی باوەر ..!!

بەڵی چونکە ئارام گرتن رووناکیە ، هیواو ئومید چرایە ، ئەوانە درمانی بی هیوایە ، وە ( خـوای گـەورە ) نائومید لەدەستی نادا ئەجرو ئـارامی گـرتن لـە پینـاو دا ،وە خۆشـی بەختـەوەری پـی دەدا ، بـۆ دوای ماوەیەك.

---

[١٠١] - سورة القلم (٤٨).
[١٠٢] - سورة يوسف (٨٧).